# ئازار و ئەوین

## بەشێك لە دیوانی

## سابیر سەعید شوکری

## (ڕازی)

1937 - 2015



## بەشی چیرۆك:

## چیرۆکێکە دەماودەم هاتووە

# پەیمان شکێنی و پەشیمانی

بێینە ســـەر بـاسـی دڵداری لادێ *** بزانیـن ئە نجام ئـەمەنباتە کوێ
پێشەکـــی چوینـــە دێیەك قەراغ شار *** ڕازاوەی سروشـــت دڵگیـر و نازدار
لە پشت ئاوایـــی شاخێکی لوت بەرز *** سنگـــی ئاسمانی هێنابـــوە لەرز
لە بەردەمـــی دێ باغ و دارستـــان *** چنـار و داربی، لەگەڵ میوەی جوان
لە لای ڕاستی دێ چەمێکـــی پڕ ئاو *** لەگەڵ چەند درەخت لە خواوە ڕواو
ناوی ئەو دێیە (کانـــی شێخان) بوو *** تـابڵێـــی خۆش و دڵگیـرو جوان بوو
دێی (زۆراب ئاغا) پیاوی ناو پیاوان***نان بدە و خێر خوا و خاوەن دیوەخان
کوڕێکی هەبوو تاقانەی کـــوڕ بوو *** لـــە ناو لاواندا بـــەوێنەی دوڕ بوو
کوڕی ئاغای دێ ناوی (سەردار) بوو *** لاوێکی زانـــا و جوان و وشیـــار بوو
هەر لـــەو دێیەدا حاجی (نەریمان) *** کچێکی هەبـــوو وەك پـەری ئاسمان
نـــاوی (گوڵاڵە) ڕومـــەت گوڵاڵە *** زوبان لـــە وەسفی جوانی ئەو لاڵە
ئەت وت فریشتەی بەهەشتی خوایە *** دەرگـــای کـراوە و ئـــەو بەرەڵایە
لە چاوی: هەی داد، لە لە نجەی: هاوار***بەستەی زوڵفی بوو دڵی چەند دڵدار
(گوڵاڵە)ی نـــازدار بەتیـری ئەوین *** (سەردار)ی شێری دابـو لە زەمیـن
ببوە حەلقەی گوێـــی ئەو خانومانە *** لـە دەوری گۆنـەی وێنەی پەروانە
(گوڵاڵە)ش هەر وا بەتیری (سەردار) *** پێکـرابوو نـــەییوو ئارام و قەرار
هەردوو وەکو یەك گیـرۆدەی دڵ بوون *** بولبولی شەیدای دیداری گوڵ بوون

# (خوازبێنـــی)

( سەردار ) ئەو ڕازەی لای باوكی دركاند *** كڵپــەر دەرونی كپـی دامركاند

وتـــی بابەگیان جوانـــی ( گوڵاڵە ) *** دڵی لێ سەنـدوم حاڵم بێ حـاڵە

ئاگـــری عەشقــی بەربۆتە گیانــم *** تینـــی داوەتە مۆخ و ئێسقانـــم

باوكـــی وەڵامی جوانـی دایـــەوە *** ( سەردار )وەك خونچەی گوڵ گەشایەوە

وتـــی ڕۆڵەگیان بەســـەر دوو چاوم *** كــوڕی شیرینم ڕۆڵــەی تــەواوم

( حاجی نەریمان ) پیاوێكـــی چاكە *** ناســـراوی دێیە دەست و دڵ پــاكە

بە ڕاستی كچێ پەروەردەی ئەو بـــێ *** ئەبێ خاوێنتــر لە ئــاوی شەو بێ

ئەمشەو ئەچینە ماڵــی ( نەریمان ) *** ( گوڵاڵە )ی كچـــی ببەخشــێ پێمان

باوكــی( سەردار )و مەلای ئاوایـــی *** لەگەڵ چەند پیاوێ بە قەدر و بایــی

چون بــۆ داخوازی ( گوڵاڵە )ی كێوی *** كە خوێنی ( سەردار ) ئەتكا لە لێوی

( حاجی نەریمان ) گوڵـــی دا پێیان *** خوا دەرگای خێری كـــردەوە لێیــان

( گوڵاڵە )و( سەردار ) بەیەكتر شاد بوون***بونە دوو هاوسەر لەخەم ئازاد بوون

بـــەڵام بزانیـــن نـەخشی زەمـــانە *** چۆنـــی كێشاوە ڕەنگی ئەم دووانە

شەش مانگ تێپەڕی بــە خۆشی و شادی*** بـــە خۆشی دڵ و بــەستەی ئازادی

## (ڕاز و نیـــاز)

شەوێك ( گوڵاڵە ) ڕوبـــەڕوی سەردار *** شانی دادابوو لێی ئەکـــرد پرسیار
باســی ڕابوردو و ئێستە و داهاتـــوو*** بۆ یەکیان ئەکرد هەردوو دوو بە دوو
( سەردار ) ڕوی کردە خێزانــی جوانــی *** وتــی ( گوڵاڵە ) تـــۆ هیوای ژیانی
خۆ ئەگـــەر تۆیان نەدایە بـــە من*** بەخە نجەر جەرگی خۆم ئەکرد ئە نجن
سوێندم بەو خوایە کە بێ هاوتایە *** نەم ئەویست ژیان لـــەم ســەر دنیایە
ئێستا سوپاس بـــۆ پەروەردگارم *** دڵـــی نەشکاندم سازی کـــرد کـــارم
وەڵامـــی داوە ( گوڵاڵە ) خـــانـم *** وتی ( سەردار ) گیـــان ئارامی گیانم
شەرتە بەشەرتی خـــاوەن بەڵێنان *** بە ئاوارەیـــی بێ جێگـــە و شوێنان
بە وەفای ( زین ) و بەناکامی ( مەم ) *** بـــە فیداکاری ( دێوانە ) بـــۆ ( شەم )
بۆ تۆیـــە مانم بۆ تۆیـــە ژینـــم *** هـــەر بەتۆوەیـــە توانـــا و تینـم

## (حاجی نەریمان ژن بۆ کوڕی دێنــــێ)

( حاجی نەریمان ) باوکـــی ( گوڵاڵە ) *** تەنیا کوڕێکی هەبـــوو لـــەو ماڵە
تاقانە کوڕ بوو تەنیا هەر ئەو بوو*** تەمەن بیست ساڵان ناوی( خەسرەو )بوو
کەوتـــە ڕاو تەکبیـــر ژنی بۆ بێنـــێ *** هەتا خـــۆی مـــاوە دای بمەزرێنێ
هەر لە دێی خۆیان بۆی کردبوو دیاری *** کەوتە تـــەدارەك بۆ کـــارو باری
شەرتی کردبـــوو ( حاجی نەریمان ) *** ئاوایی دەنـــگ دا ڕۆژی ژن هێنـــان

له مەیدانی دێ شایی و ڕەشبەڵەك *** سازكـــا بۆ لاو و كیژی چـــاو بەڵەك
حەو شەو وحەوت ڕۆژ دەهۆڵ زرمەی بێ***وەك هەوری بەهار ناڵەو گرمەی بێ
لاوان چـــاوەڕوان بۆ ڕۆژی شایـــی *** ئاخ و داخـــی دڵ بكـەن كۆتایـــی

# (ڕۆژی شایـــی)

دانیشتوی نـــاو دێ كرا ئاگـــادار *** ڕۆژی پێنج شەممە كەس نەچێ بۆ كار
له ماڵـــی حاجی شایی و زرمەیە *** قریوه و عیوه و هاوهو گـــرمـــەیـــە
بەیانـــی شایی كاتـــێ ڕۆژ بۆوه *** له دەشتی بەردێ كـــوڕگەل كـــۆ بۆوه
هەر یەك بـــە جۆرێ هاتبونە دەر *** پشتێنی حـەو چین خە نجەر لەكەمەر
ڕانكوچۆغەی شاڵ یان جلی فاسۆن *** تاك تاك و دوو دوو پیاوی پیر و كۆن
ئەهاتنە سەیـــری نەوەی لاویـــان *** فرمێسكـــی شادی ئـەڕشت چاویـــان
لەم لاوە كیژان ڕومەت تۆپی گـوڵ *** چاو پڕ لـە سورمە گەردن پڕ سومبوڵ
ئالاو والا پۆش گەردن پڕ لـە خاڵ *** بالا شۆڕەبـــی گۆنـــە گوڵـــی ئـاڵ
كراس گوڵ گوڵـی هەیاسـە له پشت *** بالا شوشەیـــی گۆنـا خـــڕ و خشت
هێندێك شـۆڕە ژن كـــارامە و زانـا *** له ئیش و كـــارا شـــارەزا و تـــوانا
دەس بەكار ئەبن لـە ڕۆژی شایـــی *** چـاودێری ئیشن تـــا ڕۆژی دوایـــی
كوڕوكاڵ پۆل پۆل بە ئەسپ و مایـــن *** ڕمبازی ئەكەن لـــە دەوری شاییـن
جارجارە شایـــی دەستی بەر ئەدا *** ئەسپ سوار بـــە غار ئەیدا بـە هەردا
یەك له قینی یەك وڵاخ ئەدەن تاو *** سوار و ئەسپ و زین ئەنیشێ لـە ئاو

# (پێش هات)

( سەردار ) یەکێ بوو لـــە و ســوارانــە  ***  زاوای زاوا بوو، دۆستـــی یــارانە
وڵاخـــی ژێری تونـــد و لـــە بــارە  *** هـــاژە و نرکەی بو وێنەی تەیـــارە
هەموو هاتنە سەیـر ڕمبازی ( سەردار )***خۆی وەك( تەهمتەن )ئەسپ وەك باڵدار
کەس نەبوو بگا بـــەتۆزی پێـی دا  *** زەوی ئەکشـا لـە تەنگـــی ڕێیـــدا
جارێك و دوو جـــار سێ هەتا چـــوار *** ببوە سەرکـــردە و تـاقـانەی ســوار
بووە هەل هەلە و بـــە چە پڵە ڕێزان*** هاتبووە چونبوش فریشتەی ئاسمان
ســـەری دواین جـــار گەڕایـە دواوە  *** لە گـەرمی غارا لـــەو تیـن و تـاوە
مەرگ ڕێی پێ گرت لە نـــاوەندی دێ *** چاڵێك هاتە بەر سمـــی ئەسپەشێ
قـاچی ئەسپ چو بـــە کونی مشکـــا  *** ( سەردار ) کەوتە تل، گەردنـــی شکا
گەیشتنە ( سەردار ) لاشەی بێ گیان بوو*** شایـــی بو بەشین شادی بە ژان بوو
دەك ڕە نجەڕۆبی زەمـــانەی بێ بـــار ***بێ( سەردار )ت کرد( گوڵاڵە )ی نازدار
چاوانـــی پــڕ کل فرمێسکـــی تێزا  *** تەرمی بێ گیانـــی وا لـــە ئامێزا
ڕومەت بەچڕنوك سەرسنگ بە لێدان***مەحشەری هەستان لە ( کانی شێخان )
تەرمی( سەردار )یان برد بۆ گۆڕستان***ڕە نجەڕۆ و بەد بەخت( حاجی نەریمان )
چە پۆکـــی مەینەت درا لە چـــاوی *** بـۆ زاوای بەد بەخت کچـــی دامـــاوی
بە دەم لەرزەوە گـــــەیشتەوە ماڵ  *** ژیانی لێ بـــوو بـــە دۆزەخـــی تاڵ
هەتا نیوە شەو لـــەرز دای چۆقـانـد  *** ڕیشەی ژیانـــی لە بنـــا قرتانـــد
چاوی لەیەك نا، گیانی تەسلیم کرد ***خوا گیانی پاکی بۆلای( سەردار ) برد
( گوڵاڵە ) خەمی بو بـــە دوو خەمە  ***  بـــە ڕاستی جـەوری زەمـــان ستەمە

# (بڕیاری گوڵاڵە)

(گوڵاڵە )ی گوڵ ڕوو بو بە کۆیلەی خەم *** ئاسۆی ئـاواتی بووە هەور و تەم
بڕیـاری وادا لــەســەر گـۆڕی یــار *** بمێنێتەوە هــەتا ئــاخر کــار
خێوەتێ هەڵـدا لــەسەر مــەزاری *** نەشکێنێ شەرت و پە یمانــی یاری
خــۆی پێچایەوە چو بـو گۆڕستان *** خێوەتی هەڵدا شاهی چــاو مەستان
فرمێسکی گەشــی ئەڕشتە سەرخاك *** سکاڵای ئەکر لە چەرخــی بێ باك
ئەی لاوانــدەوە ئەی ووت خودایــە*** گیانم بەرەڵای، (سەردار) تەنیایــە
(سەردار)م نەما بـۆ مــن بمێنم؟ ***دڵ بەکێ خۆش کەم، یــا کێ بدوێنم؟
ســەری خۆی ئەدا بە دارو بــەردا ***خۆڵی گۆڕەکــەی ئەکــرد بــەسەردا
خــزم و کەس و کار ئـەچونە دیاری *** سستی ئەکــردن ناڵــە و هــاواری
ئەی ووت ئەی یاران چیە تەکبیــرم؟*** گەردن بــەتەوق و پێ بــە زنجیرم
شەرتە بەشەرتی وەفــای دڵداری *** گیانم تەسلیم کــەم لەســەر مەزاری
شەرتە هەتاکو دەرئەچێ گیانــم *** گەردون بێــزار کــا ناڵەی گریانــم
فەلەك نەمێنێ نــاو و نیشــانت *** وەك مــن گەرم بێ ناڵــەی گریانت
وەك بێ( سەردار )بوم تۆش بێ سەردار بی*** ئازیز مردو بــی کەوتوی دیار بی
وەك دەرونی مـن دەرون قرچــاو بــی *** وێنەی جەرگی من جـەرگ بڕاو بی
(گوڵاڵە )ی بەدبەخت هەروا مایەوە *** نەی ئەهێشت هیچ کەس بێ بەلایەوە

# (ناو شار)

گەڕاینەوە شـــار بزانیـن چییـــە؟ ***دەمێکـــە لـــەوێش هـــەواڵمان نییە
لێرە(گوڵاڵە ) بـــا بەجێ بێڵیـــن *** نەختێ لـــە زەوی نـــاو شار بکێڵیـــن
ئەڵێن لە ناو شار دز پەیـــا بـــووە *** ماڵی چەند کەسیـان وێـران کردووە
لـــە ناو شار دزی، لـە دێهات تاڵان *** فەقیـــر و هەژار دەم بـە سکاڵان
حاکمی وڵات کەوتـــە ڕا و تەکبیـر*** دز و پیـــاو خراپ چۆن بخاتە گیـــر
ئەڵێن ســـەرکردەی ئەم پۆلە پیاوە *** منالێ کـــارێکە خـەتـــی نـــەداوە
حاکمـــی وڵات فـــەرمانـــی داوە *** بکەونـــە ڕاویان لە هەر چـــوار لاوە
هێزی تەیارکرد بچنـە شکاریـــان *** نەهێڵن شوێن و جێگـــە و دیـــاریان
ئەو هێزە پۆل پۆل کەوتنە شاخ و کێو *** ئـــازا و جەربـــەزە چالاك و بزێو
سەرکـــردەی هێز ناوی ( دارا ) بـوو *** لـــە شۆخ و شەنگی تەواو دارا بـوو
باڵا شوشەیی جـوان و پێکەوتـوو ***وەك مانگی چواردە لە کەل دەرکەوتوو
حاکـــم مۆڵەتی چل شـــەوی پێدا *** ئەبێ لە ژێـــر عەرز بیان کـا پەیدا
بێتو بـــە چل شەو نەیان فەوتێنێ *** لـــەو تۆڵەیەدا گیانـــی دەردێنـــێ
لـــە ترسی فەرمان حاکمی زۆردار *** ( دارا ) ئەلـــەرزی نە یمابـــوو قـەرار
بە شەو و بە ڕۆژ نەیان بوو ســـرەوت *** ئەیان پشکنی دێهات و ئەشکەوت
( دارا ) ئـــارام و ســـرەوتـــی نەمـا *** وێنـەی چۆلەکە کەوتبـووە سەمـــا
بـــە دەوری خۆیـــدا ئەسوڕایـــەوە *** ڕووە قا پـــی خـــوا ئە پـــاڕایـــەوە
لە تـاو مـەراق و ترســـی ســـەرداری *** ملـــی نایـــە ڕێی ون و نادیـــاری

ســـواری ئەسپ بوو بەتەنیا ســـوارە *** ملـــی ڕێگای گـــرت کـــز و ئاوارە

هەتـــا نیوە شـــەو بەتەنیا گەڕا *** تیـــن و تـــاقـــەت و ئارامـــی بڕا

لـــە خەیـــاڵ دا بوو بەدەم ڕێگاوە *** هەنگـــاو بەهەنگـــاو لێکـــی ئەداوە

لـــە پڕ داچڵەکی خەیاڵی پـــڕی *** ئـــاگرێکـــی دی ئـــەدرەوشا گـــڕی

ڕووەو ئاگـــر چـــو بزانێ چـیـــە؟ *** دۆستـــە؟ دوژمنـــە؟ یا کاروانچییە؟

کاتـــێ نزیك بـــو دی گۆڕستانـــە *** بیستـــی دەنگـــێ دێ دەنگی گریانە

دەنگـــێ لە گەروی هەڵقرچـــاوەوە *** بەئێش و ئـــۆف و تیـــن و تـــاوەوە

## (چاوپێکەوتنی "دارا" بە "گوڵاڵە")

( دارا ) سەرســـام بو بـــەم نیوە شەوە *** کـــێ یە برینـــی جەرگی پڕ هەوە

هاتە خوار لـــە زین ڕۆیی بەرەو دەنگ *** بـــە دڵە کوتێ بە دەرونی تەنگ

چـــوە لای خێـــوەت لکێکـــی لادا *** دی مانـــگ ڕوخسارێك لە بەر چرادا

ئاونگـــی فرمێسك لەسەر ڕومـــەتی *** مـەگەر هەر یەزدان وابێ سنعەتی

هاتۆتە خوارێ مانگـــی چواردەمیـــن *** یا حۆری بـــەهەشت هاتۆتە زەمیـــن

( دارا ) ئەمەی دی زمانی لەنگ بوو *** سەرخۆشی مەی و بێ هۆشی بەنگ بوو

گـــەروی وشك بوو ئەژنۆی هاتە لەرز *** چـــاوی هەڵبـــڕی شۆخی بـاڵابەرز

( گوڵاڵە )ی ژاکـــاو کەبینـــی ( دارا ) *** دڵـــی داخورپا نـــە یما مـــودارا

بە یەکەم نیگا تیـــر دای لـــە دڵی *** بو بـــە پێکەنیـــن گریانی کوڵی

وتی بەخێـــربێی هێـــز و هەناوم *** فێنکـــی گەروی تینـــو و قـــرچاوم
تـــو خوا تۆ جنی یا پەری ئەی جوان *** چۆن ڕێت هێنایـە چۆڵ و گۆڕستان؟
لـــە کام جیهانی یـــا کام وڵاتی ؟ *** سەوداسەری کێی بـــۆ ئێرە هـــاتی؟
( دارا ) وەڵامـــی ( گـــوڵاڵە ) ی داوە *** وتـــی چاوەکـــەم هێـــزم نەماوە
میـــوان داریم کە جەرگـــم بڕاوە *** تیـــری جوانـــی تۆ لە دڵمـــی داوە
نازانـــم مـن کێم نازانـــم ڕێگـــام *** نازانـــم خەوە یـــاخود بەئاگـــام
ئەگـــەر خەو نی یە، لـــەم گۆڕستانە *** بـــەم نیوە شەوە لـــەم بیابانە
پەری زادەیەك وەك تۆ شۆخ و شەنگ *** لێرە چی ئەکا بێکەس و هاودەنگ؟
وەڵامـــی داوە ( گوڵاڵە )ی ڕو گـــوڵ *** وتـــی دەرمانـــی ئاخ و داخـــی دڵ
لـــە تـــاو دەردی دڵ لێرە گریـــاوم *** بـــە زنجیـــری دڵ پێوەند کـــراوم
تـاوانـــی دڵـــە بومە دێوانـــە *** شێت و پەتیـــارەی ئـــەم گـــۆڕستانە
لـــە دوای دڵ وێڵـــم دڵـــم ون بووە *** بە تیـــری ئەوین جەرگم کون بووە
بەڵام تـــۆ بویتە دەرمانـــی ئێشم *** ئیتـــر هەناسەی بێ ســـود ناکێشم
سارێـــژ بـــو زامم ئـــارام بو دڵم *** گـــەش بۆوە بـــەری ژاکـــاوی گوڵم
فەرمو سەربنـــێ ســـەر ڕانـــی نەرمـم *** با ماندوت دەرکـــا بـاوەشـــی گەرمـم
لێوانت بکـــە میـــوانـــی لێـــوم *** دەستت بنێ ســـەر دوو مەمـــی سێـــوم
پـــاراوکە لێـــوی وشك و قـــرچاوم *** وشك کـــەرەوە چـــاوی گـــریـــاوم
هـــەردوو تێك ئاڵان چنـــار و لاولاو *** مـــردو گۆڕ بەگۆڕ جـــەردە دوابڕاو
گۆنـــە وەك مەمك ئەمژرا بـــەدەم ***وەك مانگـــی چـواردە بگیـری بەتەم
ئەم جوتـــە جۆرێ ئاڵابونـــە یەك *** کەس نەی ئەزانی دوانن یاخود یەك

# (پرسیاری "گوڵاڵە" لە "دارا")

کاتێ کــە تێر بون لە یەکتر لێسی *** ( گوڵاڵە ) خانـم لـە ( دارا )ی پرسی

وتــی بینایــم ڕۆحی ڕەوانــم *** چــۆن هاتیە ئێــرە ئارامی گیانــم

یــا خوا بەخشی پێـم دەرمانی دەردم *** گەر تۆی نەدایــە بێ شك دەمردم

ئێستا خوا گیانــی دوبارەی دامــێ *** بوومــە هاوشانی نەو تول نەمامــێ

( دارا ) هەناســەی ساردی هەڵکێشــا *** دڵــی ( گوڵاڵە )ی لـە ناخا کێشا

وتی چاوەکــەم مەرگ چاوەڕێمــە *** ئەمڕۆو سبەیە ئــەم دنیا جێمــە

حاکــم لە دوای دز منــی ناردوە *** فەرمانــی دامێ و سوێنــدی خواردوە

بێتو بــە چل ڕۆژ نەیانکەم پەیدا *** سەرم لــە لاشەم بێ شك ئەکا جیا

حاکــم بە قینە تۆڵــە ئەسێنێ *** لــە جێگەی ئەوان گیانــم دەردێنێ

منیش لــەم بارە لێپرســـراوم *** سەرکردەی پۆلــی چەند دەستە پیــاوم

بە پەلە هاتویــن بۆ چەتە کوشتــن *** لە حاکم وایە گوێزی ناو مشتــن

ئێستــا نازانم چی بێ تەدبیــرم؟ *** وەك مــەلی هەژار لە داوا گیــرم!

# (گولاڵە)

( گولاڵە ) وتـــی ڕۆحـــی ڕەوانـــم *** دکتۆری زامـــی پـــڕ ئێش و ژانـــم
من چارت ئەکـەم دڵت نەبێ تەنگ *** گیانم پێشکەشت لاوی شۆخ و شەنگ
مەترســـە ســـەرت بنێ سەر ڕانـــم *** لێـــوانت بنـــێ بانـــی لێوانـــم
وەرە پێشەوە دەست لـــە ملـــم کە *** بۆنی شەمامـــەی سەر بـــە گوڵم کە
ئەم گۆڕە کـــەوا لەبـــەر دەممانە *** بۆ ڕزگـــاری تۆ چـــارە و دەرمانـــە
تـــازە مـــردوە نـــەرم و نیانە *** تەنیا حـــەوت ڕۆژە کـــە بێ گیـــانە
لاشەی نـــەرم و نۆڵ هیچ نەژاکاوە *** ئـەو ئەکەین بەدز لەجێی ئەم پیاوە
ئەڵێیـــن سەرکردەی دزان کوژراوە *** ڕزگـــارت ئـــەبـــێ لـــەم گێژ و داوە
نـــاوت دەرئەچێ پاداشت وەرئەگری *** فرمێسکی چاوی لێقەوماو ئەسڕی
خۆشەویستی لای ئەهلی شار ئەبی *** لـــە ناو ناواندا تـــۆ نـــاودار ئەبی
ئێمەش شاد ئەبین بەیەك دوو بەدوو ***ئەیخەینە نـــاو گۆڕ خەمـــی ڕابوردو
هاودەمی یەکین تا دوا کاتی ژیـــن *** ئەوسا تێر ئەبین لە یەکتر مژیـــن
( دارا ) بـــە شادی وتی نازەنیـــن *** بـە کەنیزەت بێ خەرامانـــی چیـــن
بـــەڵام چۆن کفنـــی بەری بگۆڕین؟ *** تـــازەی کەینەوە لاشـــەی بشۆرین؟
جل لەکوێ بێنین بیکەینە بـــەری ؟ *** لـــەکوێ پەیاکەین شیر و خە نجەری؟
وەڵامـــی داوە ( گولاڵە )ی عەیـــار *** وتـــی دەرمانـــی دڵـــی برینـــدار
جل و پۆشاك و شیـــر و خە نجەری *** ئەوەتا لای مـــن، تۆ بێ خەبـــەری
بـــۆ یادگاری هـــەمـــوی لای منـــە *** ئـــەو گڵە لابـــە ئـــەوەی لەبنـــە

بەڵــێ (گوڵاڵە ) پەیمانی شکان *** نایــە پێناوی لــەزەت بۆ گیــان
بەڵێنی ڕاست و شەرتی لــەمەوبەر *** هەموی گۆڕیەوە بە دوو مــاچی تەڕ
هــەردوو بەربونــە گۆڕی بێتاوان***( سەردار )ی هەژار کۆست کەوتوی باوان
لاشەی بێ گیانیان لــە خاك دەرهانی *** کفنیــان دڕی لــە پێ تــا شانی
بیــری کردەوە ( دارا ) بوو بێ دەنگ *** وتــی ( گوڵاڵە ) بــالا شۆخ و شەنگ
سەرۆکــی دزان خەتــی نەداوە *** ئــەمــە ســمــێــڵی تــەواو ڕواوە
لــەگەڵ ئەوەشدا ڕەنگــی زەرد بووە *** ســنگی شکــاوە ملــی ورد بــووە
هــاتەوە وەڵام دیســان ( گوڵاڵە ) *** وتــی من بۆ تۆ حاڵــم بــێ حاڵە
سەرم ســەرگەردی ڕێگەو بانت بێ *** گیــانی ( گوڵاڵە ) بــە قوربانت بێ
تۆ خەمت نەبــێ ئەمەش ئاسانە *** شەیتــان لــە دەستی مــن هەراسانە
بە موکێش تــاڵ تــاڵ موی دەرئەهێنم *** کاتێ بێ موو بــوو وازی لــێ دێنم
بــە موکێش کەوتە سمێڵی سەردار *** دەك ڕەنــجەڕۆبــی ژنــی نالەبار
ئە مجا تەگبیــری بۆ ڕەنگی زەردی *** ئەمەش ئاســانە دەرمانــی دەردی
سواری ئەسپ بە لێدە ئاوزەنگــی *** ڕایکێشە لــە دوات ئەژاکێ ڕەنگــی
( دارا ) دەس بەکــار چی ئەو بۆی دانا *** مــردووی ڕاکێشا بەم شانا و شانا
ئە مجــا دوو بەدوو بەرەو ڕێگای شار *** بــە کشان کشان هاتن بەرەوخوار
بۆ لەزەتی گیــان پە یمانی یاری *** مــردووی هەژاری کــردبووە دیــاری
گــەیشتنە ناو شار گوتی ( گوڵاڵە ) *** سەرو مــاڵی مــن بەتــۆ حەڵاڵە
ئەت بەمە ماڵێ بکــە ئیسراحەت *** لــە گیانت دەرکــە ئازار و شەکەت
لــەوێ دانیشــە دێمەوە بــۆلات *** بــە شادمانی و دڵــی پڕ ئــاوات

جــەنازە ئەبــەم بۆ مەیدانی شار *** کـــاربەدەستی میـــر ئەکەم ئاگادار
لە دڵی خۆیـــدا لێکـــی دایـــەوە *** وتـــی لەم کـــارە چیم بـــۆ مایەوە؟
ڕوو ڕەشـــی نەبێ لـــە دیوانـــی خوا *** ئازاری ویژدان لـــە سـەر ڕوی دنیا
ئـــەم خێر نەدیوە چی یە تـاوانی ؟ *** ئەویش وەك من بوو شـــادی باوانی
گوناهی چـــی بوو ئاوای بەسەر بێ *** بەچ تـاوانێ لـــە ژێرخـاك دەربێ؟
هەر بـــۆ ئەوەندە مـــن و ( گوڵاڵە ) *** ببینە هـاودەم لـــەم ژینـــە تاڵە؟
( گوڵاڵە ) تۆڵەی چی لـێ ئەستێنێ *** ئەی ئەبێ چی تر بەسەر مـــن بێنێ
چ لاوێکـــی تـــر دڵـــی بگۆڕێ *** لاشەی دوبـــارەم دەربـــێ لـــە گـــۆڕێ
( دارا ) لەم کارەی زۆر پەشیمان بوو *** ئاو زایـە چـاوی، دڵـــی پڕ ژان بوو
خـــۆی گەیاندە لای حاکمـــی وڵات *** بـــۆی گێڕایـەوە تەواو کـــارەسات
وتـــی ئینسانم خـــاوەن ویژدانم *** لـــەم کردەوەیـــەم زۆر پەشیمـــان
حاکم کـــە بیستی کارەساتـــی وا *** وتی بکەونـــە بـــەر غەزەبـــی خوا
( گوڵاڵە )ش لێـــرە لێکـــی دایـەوە *** بـــەر بـــووە گریـــان زۆر لالایەوە
وتـــی بم بەنە دیوانـــی حاکـــم *** بـا تێی گەیەنـــم کردەوەی چاکـــم
( گوڵاڵە ) خێـــرا گەیشتـــە دیوان *** لـــە بەردەم حاکـــم بەربووە گریان
وتی بـــم کوژن کـــەی ئەمە ژینە *** ئەم کردارەی مـــن کـــەی ڕوای دینە؟
بمکەن بە عیبرەت لەسەر ڕووی زەوی *** با خاوەن هەوەس سەر بکـەن نەوی
لاشەم ڕاکێشن وەك لاشـــەی ( سەردار ) *** ئەو بێ تـاوان بوو منم تـاوان بـار
بە ئـاگـــر لاشەم چاك بسوتێنـــن *** تۆڵەی ( سەردار )م بـــاش لێ بسێنن
کـاتێ بووم بەخۆڵ بم دەنـــە دەم بـا *** نەك ڕووم ببینێ ( سەردار ) لەو دنیا

ئەم لاوە هەرگيز گوناه بار نييە *** هەرگيز شايستەی هيچ ئازار نييە

من فريوم دا بە قسەی گەرمم *** من خستمە داوی باوەشی نەرمم

من بە زوبانی لووس و پاراوم *** وەك مەلی هەژار گرتم بەداوم

بەڵام داوای من لە دادگاتان *** ئەم لاوە چاكە وەستاوە لاتان

بی بەخشن توخوا تاوانبار نی يە *** لەم كەين و بەينە ئاگادار نی يە

حاكم ئەمری كرد چاوی دەربێنن *** ڕومەتی ڕەش كەن وازی لێ بێنن

با لە تاريكی ژيان بناڵێ *** سزا بچێژێ هەتا چەند ساڵێ

حەيفە زوو بمرێ بحەسێتەوە *** با بە زەليلی سەر بنێتەوە

( دارا )ش دە ساڵ بەند درا بەسەريا *** پێ وەند لە پێ يا، قەيد لەكەمەر يا

ئەمە ئە نجامی هەوا و هەوەسە *** بۆ كەسێ ژير بێ ئەم پەندەی بەسە

هەرگيز گوێ نەدەی بەهەوای گيانی *** يا سزای ويژدان يا سەرگەردانی

